دیار دوسکی

بەری بهارا گوندێ مە ب دویماهیك هاتبا، دا مالێن مە بارکن و بەرێ زۆما چن. زۆم ل دەڤ مەزارویا، جیهانەکا تایبەت بی، بەری چونا مە بو زۆمێ جهی، ئەم ژ کەیفا تێ نەد نڤستین... رۆژ ل دویڤ رۆژێ مەد هەژمارتن.

هەر ل گەهشتنا مە بو زۆمێ، دا کەڤینە ناڤ مێرگێن تراشا. ل هیلینێن چویچکان تێژکێن ئەوا گەدیێن. پشتی چەند رۆژکا، د هەر ئێك ژمە بتە خودانێ هندە چویچکاو یێ زیرەك با، دا بو خو هندەك تێژکێن کەوا ژێ گرت. جارەکێ ئێشتێ ژ من مەزنتر تێژکەوکەکا فرەکە گرت و دا من. گەلەك ب وێ دیاری‌یێ ئەر پێ خوشبیم و من ژ هەمیەکێ ب نرخ تر ددانا... من کرەد رکەکێ دا، ئاڤ و گەلەك توخمێن تومکێ کرنە بەر... چەند رۆژا ئەز روینشتمە بەرامبەری ڤی کەوی، کوئە و دمی ل ئاڤێ یان تومکێ ب دەت، من نە دیت!! رۆژەکێ باپیرێ من ژ من پسیارکر، کا کەوێ من بێ چەوانە، من گوتێ کر چر ناخوت و ڤەخوت. من ژێ پسیارا وی کر، کا چ تشت ژ هەمی‌یا پتر، کەوی د ڤێت، دابو ب ئینم، کا ناخوت؟

باپیرێ من گوت:

ـ کورێ من، وی ئازادی ب تنێ د ڤێت... ئازادی ژ هەمی توکێن تو د دەیی ب تام ترە، هەرە ئازاکە.

من کەوێ خو ژ رکێ دەرئێخست و بلندکر، ئەو فری و چو ل بەتەنەکا بەرامبەری کوینێ مە دا داو دەست ب چەرینێ کر... چاڤێ من مالێ و بو جارا ئێکێ بێ من هزرا ئازادی‌یێ داکری.

○